دکتۆر احمد میرزا میرزا
پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە مێژووی ئیسلامی

# بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە کوردستان

## لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی شیکارییە

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە
بورهان حاتەم گۆمەتاڵی



# بڵاوبوونەوەی ئیسلام
# لە کوردستان

لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی شیکارییە


**نوســـینی**

**د. أحـــمد مـــیرزا مـــیرزا**

پرۆفیسوری یاریدەر لە مێژووی ئیسلامی

کولێژی ئەدەبیات - بەشی مێژوو - زانکویی صلاح الدین/ هەولێر


وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە

**بورهان حاتەم گۆمەتاڵی**





# بڵاوبوونەوەی ئیسلام

# لە کوردستان

**نوسـینی**
دکتۆر أحمد میرزا میرزا
**وەرگێرانی لە عەرەبییەوە**
بورهان حاتەم گۆمەتاڵی
**بڵاوکردنەوەی**
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە
**نەخشەسازی ناوەوە و بـەرگ**
نەوزەد شەهکاوانی
**خـەت**
نـەوزاد کـۆیـی
**قـەبـارە**
١٤× ٢١ - ( ٤٨ ) لاپەڕە
**نۆرە و ساڵی چاپ**
یەکەم ١٤٣٧ ك - ٢٠١٦
**تـیراژ**
١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی
سپاردنی ( ٢٣٣ ) ی ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

# پێشەکی

ئەم لێکۆڵینەوەیە ناساندنێکی کورتی ناوچەی کوردستان و کورد و بنەچە مێژووییەکانی کوردی لەخۆگرتووە، کە بەڵگەیە لەسەر گرنگی کورد و ڕەسەنایەتییان لە بوارەکانی شارستانێتی ئیسلامیدا.

لەڕاستیدا پێوەندی کورد بە ئیسلامەوە دێرینە، هەندێك لە سەرچاوەکان بوونی ئەم پێوەندیەیان بۆ سەرەتای دەرکەوتنی ئیسلام گەڕاندۆتەوە، کاتێ هاوەڵی پێغەمبەر جابانی کوردی بەدیداری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە مەدینەی منەوەرە گەیشتووە، هەروەها کۆمەڵێك بازرگانی کورد لە هەرێمی جەزیرەوە چوونەتە تائیف و لەوێ موسڵمان بوونە و دواتر گەڕاونەتەوە بۆ شارەکانیان و ئیسلامیان تێدا بڵاوکردۆتەوە، سەرکردەی کورد (دەیلەمی کوردی) - کە لەسەر دەستی هاوەڵی پێغەمبەر جابانی کوردی موسڵمان بووە و سەرۆکی پاسەوانی کیسرەوی بووە - لەپاڵ موسڵمانان لە شەڕی دژ بە هێزەکانی ساسانی لە جەنگی قادسیەدا بەشداری کردووە.

بەڵام دەسپێکی فەرمی هاتنی کورد بۆ نێو ئیسلام دوای سەرکەوتنی موسڵمانان بوو لە جەلەولا لە ساڵی (١٦هـ/ ٦٣٥ز)، سەرەتای

هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان، واتاو ئاماژەی ئەرێنی زۆری هەبوو، چونکە کورد هەڵوێستێکی ئەرێنییانەیان لە هەمبەر فەتحکەرەکاندا گرتەبەر، زۆربەی ئەو جەنگانەی، کە لەگەڵ فەتحکەرەکاندا ڕوویاندا لەگەڵ میللەتی کورد نەبووە، بەڵکو لەگەڵ هێزە داگیرکەرەکانی کوردستان بووە وەك ساسانی و بێزەنتییەکان و ئەوانەی بەهاتنی ئیسلام بەرژەوەندییەکانیان زیانی پێکەوت، ئەگەر ئەوە بزانین کورد هەر لە کاتی ڕووخانی دەوڵەتی میدیای کوردییەوە پەرتەوازە بوون، بەڵام لەڕێگەی ئیسلامەوە یەکیان گرت.

سەرەڕای بوارە مێژووییەکان لێکۆڵینەوەکە توێژینەوەیەکی شیکاری بۆ هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە کوردستان لەخۆگرتووە، توێژەر کۆمەڵە بۆچونێکی وردی زانستی خستۆتەڕوو، کە ڕاستی پێوەندی برایانەی نێوان کورد و موسڵمانە عەرەبەکان ڕوون دەکاتەوە، هەروەها ڕوونی دەکاتەوە، کە ئیسلام لەنێو کورد دا بە هەڵبژاردن و سەرپشکی خۆیان بڵاوبۆتەوە، نەك بە زەبری شمشێر، یا ترس، توێژەر بۆ پشتڕاستکردنەوەی بۆچوونەکانی، پشتی بە زۆرێك لە سەرچاوە ڕەسەنەکان و لێکۆڵینەوە بێلایەنەکان بەستووە.

لە پێشەوەی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان، کتێبی بەناوبانگی (فتوح البلدان) ی (البلاذري) و، کتێبی (الفتوح) ی (ابن اعثم الكوفي) و، (تاريخ الطبري) دێت. لە ژێدەرە نوێیەکانیش کتێبی (التاريخ الاسلامي) ی (محمود شاكر) و، (خلاصة تاريخ الكورد وكوردستان) ی (محەمەد ئەمین زەکی) و، (ظهور الكورد في التاريخ) ی (جەمال ڕەشید) و چەندان سەرچاوەو ژێدەری دیکە.

کورد بە یەکێك لە میللەتانی ڕۆژئاوای کیشوەری ئاسیا ئەژمار دەکرێت، هەر لە دێرین زەمانەوە ئەو ناوچەیەی دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی تورکیا و ڕۆژئاوای ئێران و باکوری عێراق و سوریا و بەشێك لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوی، بۆتە شوێنی نیشتەجێبوونی ئەو[١].

وشەی کورد لە مێژوودا بەچەندین شێوەی جیاواز هاتووە، لە هەندێ کاتدا مانا و چەمکی جیاوازی هەبووە لەوەی ئێستا هەیە، بۆ نموونە وشەی (کور) لای سۆمەرییەکان بە مانای چیا دێت[٢]، لە سەردەمی ئاشورییەکاندا ناوەکە بە مانای پیاوی ئازا و تەندروست و خودان هێزی جەستەیی هاتووە، ئەم زاراوەیە بەردەوام بوو لە بڵاوبوونەوە، بەڵام مانای ئەوەش دەدا، کە کەسێك لە ناوچە شاخاوییەکانەوە هاتبێ، جا نەتەوە و بنەچەی ڕەگەزی هەر جۆرێك بێت[٣]، وشەی کورد هەر لە سەردەمی لەدایکبوونی مەسیحەوە (سەلامی خوای لێ بێت)، تا ئێستاش زێتر بە مانای ئەوە دێت خەڵکانێکن سەرجەم تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانیان تێدایە، کە لەمیانەی تێپەڕبوونیان بە چەندان قۆناغی مێژوویی لە ناوچەکانی نیشتەجێ بوونیان گەشەیان کردووە[٤].

---

(١) بۆ پتر زانیاری بڕوانە: جمال رشید احمد: ظهور الكورد في التاريخ، (اربيل: ٢٠٠٣)، ص ص٤٤٧-٤٢٧.

(٢) يوسف خلف عبدالله: الكورد وعلاقته بالمفردات السومرية من خلال النصوص المسمارية، مقال منشور فی مجلة شاندر الدورية، (اربيل: ٢٠٠٠)، العدد (١٢)، ص ص١١٢-١١٤.

٩٣) جمال رشيد احمد و فوزی رشيد: تاريخ الكورد القديم، (اربيل: ١٩٩٠)، ص٧.

(٤) بۆ پتر زانیاری بڕوانە: جمال رشيد: ظهور الكورد في التاريخ، ص ص٤٥٦-٦١٥.

خاکی ئێستای کوردستان، ئەگەر یەکەمین لانکەی مرۆڤایەتی نەبووبێت، ئەوە لە بەرایی ئەو ناوچانەیە کە ژیانی تێدا دەرکەوتووە و شارستانییەتی تێدا گەشەی کردووە[١].

هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانی ژیان، کوردستان کەوتۆتە چوارچێوەی ناوچەی کەش و هەوای مام ناوەند[٢]، شوێنەوارناسان لە ئەشکەوتی شانەدەر چەندین ئێسکەپەیکەر (هیاکل عظمیة) یان دۆزیوەتەوە، کە مێژووەکەی بۆ نزیکەی شێست هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە[٣].

مرۆڤ لە کوردستاندا لە قۆناغی کۆکردنەوەی خۆراکەوە ژیانی وەرچەرخا بۆ بەرهەمهێنانی خۆراك (واتە کشتوکاڵ کردن)، گوندی (چەرمۆ)ش بەڵگەیە لەسەر ئەمە[٤]، چاخی بەردینی کانزایی تێدا دۆزراوەتەوە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (٥٥٠٠ -٣٥٠٠ پ.ز)، دانیشتوانی ئەو ناوچەیە توانیویانە ئاسن و مس وەك کانزا بەکاربهێنن و لە ناوچەکەدا بازرگانی پێوە بکەن[٥]، لەسەر خاکی کوردستان سەردەمێك دەرکەوتووە، کە باوەڕ وایە چاخی وێکچووی

---

(١) طه باقر: مقدمة فی تاریخ الحضارات القدیمة، (بغداد: ١٩٧٣)، ج١، ص١٧٣.

(٢) ف. بارتولد: تاریخ الحضارة الاسلامیة، (القاهرة: ١٩٨٣)، ص٥٠. بۆ وردەکاری زیاتر بڕوانە: حکیم احمد مام بکر: الکورد وبلادهم عند البلدانیین والرحالة المسلمین، اطروحة دکتوراه، جامعة صلاح الدین، (اربیل: ٢٠٠٣)، ص ص٧٨-٨٢.

(٣) طه باقر: المقدمة، ج١، ص١٨٣.

(٤) محمد امین زکی خلاصة تاریخ الکورد وکوردستان، (بیروت: ١٩٨٥)، ص٤٠.

(٥) Jesper Eidem and Jorgen Laessos: The Shemshara archives 1 the letters. p.29

نووسین (العصر الشبیه بالکتابی ) بێت، لە (تل براك) ی نزیك خابور دوو دەقی لەشێوەی نووسینی وێنەیی دۆزراوەتەوە، ئەوەی جێگەی سەرنجە لەوانەیە ئەمە بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش وەرکاء[١]، چونکە بابەتەکە تا ئێستا یەکلانەکراوەتەوە.

باوەڕ وایە شارستانییەت لە لە خاکی کوردستانەوە بۆ ڕۆژئاوا گوازرابێتەوە، نەك تەنیا ئەوەندە، بەڵکو باوەڕ وایە بەشی یەکەمی شانۆی شارستانییەت لە کوردستان لەسەر دەستی کۆمەڵێك جووتیار پێشکەش کرابێت و پاشانیش بەشی دووەمی لە باشووری عێراق پێشکەش کرابێت[٢].

دەکرێ ئەم پەرەسەندنانە بنچینەیەك بووبن بۆ بنیاتنانی شارستانییەتی وڵاتی نێوان دوو ڕووباران (بلاد ما بین النهرین) لەسەر بەشێکی بەرفراوانی ئەم زەوییە، کە باوەڕ وایە یەکەمین و بەناوبانگترین شارستانییەت بێت لە جیهاندا[٣].

---

(١) Ann Lomis Pekren: Comparative archeology of early Mesopotamia, (issues by Chicago University), pp2-4.

(٢) J. R. Braidwood and Bruce: How with contributions by others, prehistoric investigation in Iraq Kurdistan, (issues Chicago University 1959), p.69.

(٣) وڵاتی نێوان دوو ڕووباران (میزۆپۆتامیا): لە ماوەی نێوان هەردوو سەدەی چوارەم و دووەمی پێش زایینیدا نووسەرانی یۆنان و ڕۆمان زاراوەی ناسراوی جوگرافی (وڵاتی نێوان دوو ڕووباران) یان بەکارهێناوە، واتە ناوی یۆنانی (Mesopotomia)، ئەم زاراوەیەی کە تا دوای بڵاوبوونی بەکارهێنانی ناوی عێراقیش بەکارهێنانی هەر باو بوو. طه باقر: المقدمة، ج١، ص١١.

جێگەی باسکردنە بە پێی دروستترین گێڕانەوە، لەوانەیە خاکی کوردستان لانکەی دووەمی مرۆڤایەتی بووبێت، هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، کە کەشتییەکەی نوح (سەلامی خوای لێ بێت) دوای ئارامبوونەوەی لافاوەکە لەسەر چیای جودی گیرساوەتەوە[١].

**سترك دەڵێ:** نووسەرە مەسیحییەکان بە چیای (جودی) یان گوتوە (چیای کوردوئییەکان)[٢]. هەروەها لە سیما دیارەکانی ڕەسەنایەتی ناوچەی کوردستان شاری ئەربل (هەولێر)ە، کە بەدرێژایی شەش هەزار ساڵ ژیان تێیدا بەردەوام بووە[٣].

سوودبەخشە ئەگەر لێرەدا ئاماژە بە دەوڵەتی میدیای کوردی بکەین، کە لە هەزارەی یەکەمدا سەریهەڵداوە و ڕۆڵی سیاسی و شارستانی لە مێژووی ناوچەکەدا هەبووە[٤].

---

(١) القران الكريم: سورة هود: (الاية ٤٤).

(٢) دائرة المعارف الاسلامية، ج١، ص١٠٦.

(٣) بڕوانە: طه باقر: المقدمة، ص ص٢٣٧، ٢١٤، ١٤٨، ٥٨٨. بڕوانە: اليعقوبی: تاريخ، ج٢، ص٤٢٧. الطبری: تاريخ، ج٨، ص٢٧٠. الدولة البيزنطية، ص٢٨١.

(٤) هەندێك لە مێژوونووسان میدییەکان بە باپیرە گەورەی کوردی ئێستا دادەنێن، دەوڵەتێکی بەرفراوان و پان بەرینیان دامەزراند و پایتەختەکەی ئەکبەتانا شاری (هەمەدان) ی ئێستا بوو. بڕوانە: محمد امين زكی: خلاصة تاريخ الكورد، ص ص١٠٧- ١٠٥- ٥٩. سامی الاحمد و جمال رشيد: تاريخ الشرق القديم، (بغداد: ١٩٨٨)، ص ص٣٦٤- ٣٧٠.

کاتێ ئیسلام دەرکەوت، کورد لە میللەتە بەراییەکان بوو، کە بەوپەڕی سنگفراوانییەوە باوەڕی بە ئیسلام هێنا و لە باوەشی گرت، چەندین سوڵتان و سەرکردە و شەرعزان و فەرمووودەناس و مێژوونووس و زانای مەزنیان لە بوارە جۆربەجۆرەکانی مەعریفەدا لێ وەدەرکەوتن و خزمەتی مەزنیان پێشکەش بە ئیسلام کرد[1].

مێژووی کورد لە چاخی سەرەتای ئیسلام و دواتریش، بریتی بوو لە بەشێکی گرنگی مێژووی ئیسلام، کورد وەك بەربەستێکی پۆڵاین وابوون، هەموو ئەو هێرشانەی داگیرکەرانیان تێکشکاند، کە لە بەرەی باکور (دەوڵەتی خەزەر و گورجستان)[2]و بەرەی ڕۆژئاوا (ڕۆمە بیزەنتییەکان و هاوپەیمانە ئەرمەنییەکانیان) دەکرانە سەر دەوڵەتی ئیسلامی[3]، دوای ماوەیەك لە سەقامگیری توانیان پشکداری لە

---

(١) حسام الدين على غالب النقشبندى: الكورد فى الدينور وشهرزور، رسالة ماجستير مطبوعة على الالة الكاتبة، (جامعة بغداد: ١٩٧٥)، ص ص٦٤-١١٢. فائز محمد عزة: الكورد فى الجزيرة وشهرزور، رسالة ماجستير مطبوعة على الالة الكاتبة، جامعة صلاح الدين، (اربيل: ١٩٩١)، ص ص٤٨-١٠٦. احمد ميرزا ميرزا: غربى اقليم الجبال فى صدر الاسلام، رسالة ماجستير مطبوعة على الالة الكاتبة، جامعة صلاح الدين، (اربيل: ١٩٩٥)، ص ص٧٩-١٠١. نيشتمان بشير محمد: الاحوال السياسية والاجتماعية والاقتصادية لغربى اقليم الجبال، رسالة ماجستير مطبوعة على الالة الكاتبة، جامعة صلاح الدين، (اربيل: ١٩٩٥)، ص ص٥٣-٦٤-١١٨-١٦١. جطة لةمانةش...

(٢) بڕوانە: اليعقوبى: تاريخ اليعقوبى، (بيروت: د. ت)، ج٢، ص٢٢٧. الطبرى: تاريخ، ج٨، ص٢٧٠.

(٣) الطبرى: تاريخ، ج٩، ص ص٥٦-٥٧. الازدى: تاريخ الموصل، (القاهرة:

پێکهێنانی یەکێك لە بەهێزترین دەوڵەتە ئیسلامییەکان بکەن، کە توانی پەلاماری خاچ دروشمەکان (الحملات الصليبية) بۆ سەر وڵاتانی ئیسلامی بوەستێنێت، لوتکەی ئەمەش ڕزگارکردنی قودسی پیرۆز بوو لە ساڵی (٥٨٣هـ / ١١٨٧ز) لە چنگی خاچ دروشمەکان لەسەر دەستی ناصر صەلاحەدینی ئەییوبی[١].

سەرچاوە مێژوویی و وڵاتناسییەکان (البلدانيين) ئاماژەیان بەسنووری نەتەوەیی کورد نەکردووە، بەڵام زۆرێك لەو گەشتیار و وڵاتناسە موسڵمانانەی، کە سەردانی کوردستانیان کردووە ئاماژەیان بەمە داوە و وەسفێکی وردی ناوچەکە و دانیشتوانە کوردەکەیان و، جگە لەوانیش و بارودۆخی ئایینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییان کردووە[٢].

ئەم لێکۆڵینەوانە بوونە کەرەستەیەکی سەرەکی و بە پێز بۆ ئەو توێژینەوانەی، کە دواتر ئەنجام دران، هەندێك لە توێژەران بە هەوڵی

---

١٩٦٧)، ص٢٤٢. أسد رستم: الروم وصلاتهم بالعرب، (بيروت: ١٩٥٥)، ص٢١٥. فازيليف: العرب والروم، (القاهرة: ١٩٣٤)، ص١٢٧.

(١) بڕوانە: ابن الاثير: الكامل، ج١٠، ص ص٣٣-٣٥. ابن رشد: النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية، (القاهرة: ١٩٩٤)، ص١٣٤. العماد الاصفهاني: الفتح القسى فى الفتح القدسى، (د.ط)، (د. ت)، ص ص١٢٧-١٤٦.

(٢) بڕوانە: كى ليسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، (بغداد: ١٩٥٤)، ص٢٢١. ابن خرداذبة: المسالك والممالك، (بريل- ليدن: ١٨٨٩)، ص ص٥٧-٩٥. ابن الفقيه: مختصر كتاب البلدان (بريل- ليدن)، ص٢٠٩. المقدسى: أحسن التقاسيم فى معرفة الاقاليم، (بريل- ليدن: ١٩٠٦)، ص٣٨٦.

جددی هەستان بۆ دیاریکردنی ناوچە کوردییەکان، لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی ئەو لێکۆڵینەوانە لە کەموکوڕی بەدەر نەبوون[١]، بەڵام تا ئاستێکی نزیك توانیان سنووری ناوچەکە دیاری بکەن.

دوای ئەوەی لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) فتوحاتی ئیسلامی بەرفراوان بوو، بۆ ئاسانکاری لە بواری بەڕێوەبردن، خەلیفە لەڕووی کارگێڕییەوە دەوڵەتی بەسەر چەندان هەرێم دابەش کرد، لەسەر ئەم بنەمایە ناوچەکانی کوردستان بەم شێوەیە دیاری کران:

أ- هەرێمی چیا[٢].

ب- هەرێمی جەزیرە[٣].

---

(١) بڕوانە: پەڕاوێزی ١ لاپەڕە ١١.

(٢) بەشێك لە وڵاتی کوردان بە هەرێمی چیا ناونراوە، چونکە زۆربەی بەشەکانی چیای سەرکەشە، ئەو هەرێمانەی لە باکورەوە سنووریەتی هەرێمی دەیلەم و گەیلان و ناوچەی ڕۆژئاوای جەزیرەیە، ئەو هەرێمانەی لە باشورەوە سنووریەتی هەرێمی خوزستان و بەشێك لە عێراقە، هەرچی لای ڕۆژهەڵاتە، سنووری لەگەڵ بیابانی خوراسان و فارس و ئەسفەهانە، لە ڕۆژئاواش سنووری لەگەڵ دەشتەکانی عێراق و جەزیرەی فوراتی و ئازەربایجانە. بۆ پتر زانیاری بڕوانە: احمد میرزا میرزا: غربی اقلیم الجبال، ص ص٢٦-٢٧.

(٣) ناونراوە بە جەزیرە، چونکە دەکەوێتە نێوان هەردوو ڕووباری دیجلە و فوڕات، لە ڕۆژهەڵات سنووری لەگەڵ ئازەربایجان و چیا هەیە، لە ڕۆژئاوا لەگەڵ وڵاتی شام، لە باشور لەگەڵ عێراق، لە باکور لەگەڵ ئەرمینیا و وڵاتی ڕۆم. بڕوانە: زرار توفیق صدیق: الکورد في العصر العباسی، ص ص٢٤-٢٩.




ج- شارەزوور[١].

د- ئازەربایجان (ئەتروپاتکان)[٢].

هـ- هەرێمی ئەرمینیا[٣].

---

(١) شارەزوور: ناوێکە لە ناوچەکە و شارەکە نراوە، ناوچەیەکە دەکەوێتە نێوان حلوان و خانەقین لە باشور، هەولێر لە باکور، چیای سلق (چیای ئێستای لاهیجان) لە ڕۆژهەڵات، داقوقا (داقوق) هەرێمی باجرمی (پارێزگای ئێستای کەرکوك) لە ڕۆژئاوا. بڕوانە: حسام الدين علی غالب النقشبندی: الكورد في الدينور، ص ص٤٨-٥٦.

(٢) ئازەربایجان: دارِشتنەوەیەکی ئیسلامی زاراوەی (ئەترۆپاتکان)ە، کە لەلایەن مێژوونووسە ئەرمەنەکان بەکاردێت، هەرێمێکی پان و بەرینە، دەکەوێتە نێوان وڵاتی چیا و وڵاتی ڕان (ئاران)، لە ڕۆژهەڵاتەوە دەریاچەی خەزەر هاوسنووریەتی، لە ڕۆژئاواوە سنووری ئەرمینیا و بەشێك لە سنووری جەزیرە، لە باکورەوە ئەرمینیا و لە باشورەوە سنووری عێراق. بڕوانە: حسام الدين علی غالب النقشبندی: اذربيجان، رسالة دكتوراه مطبوعة على الاله الكاتبة، (بغداد: ١٩٧٩)، ص ص٣٤-٣٧.

(٣) ئەرمینیا: ئەرمینیا دەکەوێتە ئەوپەڕی باکوری خاکی دەوڵەتی ئیسلامییەوە، دەکەوێتە نێوان ئازەربایجان و ئاران لە ڕۆژهەڵات و وڵاتی ڕۆم لە باکور و جەزیرەی فوراتی لە ڕۆژئاوا، هەرێمی چیا و ویلایەتی دیاربەکری سەر بە جەزیرە لە باشور، چیای (قبق) و وڵاتی کەرەج و غوز لە باکور. بڕوانە: صلاح الدين امين طه، الحياه العامة في ارمينيا دراسة في اوضاعها الادارية والاجتماعية والاقتصادية، رسالة دكتوراه، (بغداد: ١٩٧٩)، ص ص٢٢-٢٣. زرار توفيق صديق: الكورد في العصر العباسی، ص ص٣٧-٣٨.

و- هەرێمی ئەهواز[١] و فارس[٢].



---

(١) هەرێمێکی بچووکە و سنوورێکی ئاشکرا و دیاریکراوی هەیە، لە ڕۆژهەڵات هەرێمی فارس و ئەسفەهان سنووریەتی، لە ڕۆژئاوا ناوچەی (واسط)ی سەر بەهەرێمی عێراق، لە باکور هەردوو ناوچەی (صیمرە) و (لوڕ)ی سەر بەهەرێمی چیا، لە باشور ئەو هێڵە خەیاڵییەی، کە لە (واسط) ەوە بۆ دەریای عەرەب درێژدەبێتەوە. بڕوانە: زرار توفیق صدیق: الكورد فط العصر العباسي، ص ص٣٦-٣٧.

(٢) لە ڕۆژهەڵاتەوە هەرێمی خوزستان سنووریەتی، لە ڕۆژئاوا هەرێمی کرمان و لە باکور ئەسفەهان و بیابانی خوراسان و لە باشور دەریای عەرەب. بڕوانە: زرار توفیق صدیق: الكورد في العصر العباسي، ص ص٤٠-٤١.

# فەتحكردنی
# ناوچەكانی كوردستان

ناوچە كوردییەكان لەو سەردەمەدا لە نێوان هەردوو دەوڵەتی ساسانی و بێزەنتی دابەش ببوو، بەڵام بەشی هەرە گەورەی لە چوارچێوەی دەوڵەتی ساسانیدا بوو، بەبێ ئەوەی لەو ماوەیەدا هیچ قەوارەیەكی سیاسی تایبەت بەخۆیان هەبێ، لەلایەكی دیكە خاكی كوردستان گۆڕەپانی ململانێی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە بوو، بۆیە بە گۆڕینی هێزی هەر یەكێك لەم دوو دەوڵەتە، دابەشبوونی لە نێوان ئەم دوو ئیمپراتۆریەتە دەگۆڕا[١].

لەو كاتانەدا موسڵمانان سەركەوتن لە دوای سەركەوتنیان بەسەر دەوڵەتی ساسانیدا تۆمار دەكرد، كە لوتكەی ئەمەش سەركەوتنی مەزنی جەنگی قادسیە بوو لەساڵی (١٦هـ/ ٦٣٧ز)[٢]، لە ئەنجامی

---

(١) البلاذری: فتوح البلدان، ص ص١١١-١١٧-٢٢٣-٢٣٥. الطبری: تاریخ، ص ص٥٣-٣٧-١٠٢-١٠٣. احمد عادل كامل: فتوح الشرق، ص ص١١٩-١٢٢. هەروەها فتح بلاد الشام: (بیروت: ١٩٨٢)، ص ص٣٤-٣٧.

(٢) البلاذری: فتوح، ص ص٢٥١-٢٥٨. الدینوری: الاخبار الطوال، ص ص٢٥١-

ئەمەشدا پەیوەندی لە نێوان سەرکردەی گشتی هێزەکانی ئیسلامی لە عێراق سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس (ڕەزای خوای لێ بێت)[1] و خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب ڕوویدا سەبارەت بەوەی، کە پێویستە چی بکرێت، فەرمانی خیلافەت ئاشکرا و ڕوون بوو بۆ قۆزتنەوەی سەرکەوتنەکە و فەتحکردنی مەدائینی پایتەختی دەوڵەتی ساسانی، ئەوەبوو سووپا بەرەو مەدائین جووڵا و دوای ڕامالینی بەرگری ساسانییەکان، توانی بچێتە ناویەوە، ئەمەش بووە مایەی ڕاکردنی پاشای ساسانی (یەزدەگورد ٦٣١-٦٥١ز) لەگەڵ ئەندامانی داروەستەکەی[2]، سووپای ئیسلامیش بەرەو یەکەمین مۆڵگەی سووپای ساسانی (شاری جەلەولا)، کە خۆیان تێدا قایم کردبوو، جووڵا.

زۆربەی سەرچاوە ئیسلامییەکان لەسەر ئەوە ڕێکەوتوون، کە فەتحکردنی لە ساڵی (١٦هـ/ ٦٣٧ز) لەسەر دەستی هاوەڵی پێغەمبەر

---

٢٥٨. ابن الاثیر: الکامل، ج٢، ص ص٣٢٤-٣٣١.

(١) هاوەڵێکی بەناوبانگە لەسەر دەستی ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خوای لێ بێت) موسڵمان بووە، یەکێکە لەو دە هاوەڵەی مژدەی بەهەشتی پێدراوە، لەگەڵ پێغەمبەر (درودی خوا لێ بێت) بەشداری لە زۆربەی غەزاکاندا کردووە، هەروەك لە جەنگی قادسیەدا لە ساڵی شازدەی کۆچی سەرکردایەتی موسڵمانانی کردووە. ابن سعد: الطبقات، ج٣، ص١٣٩. ابن حجر: الاستیعاب فی معرفة الاصحاب، ج٢، ص٦٠٧. محمود شیت خطاب: قادة فتح العراق والجزیرة، ص ص٢٤٨-٢٩٦.

(٢) البلاذری: فتوح، ص ص٢٥٨. الدینوری: الاخبار، ص ص١١٥-١٢٠. الطبری: تاریخ، ج٢، ص ص٥٨٦-٥٨٧. ابن أعثم: الفتوح، ص ص٢١٣-٢١٨. ابن الاثیر: الکامل، ج٢، ص ص٣٣٦-٣٣٧.

(هاشم بن عتبة بن ابي وقاص) دا بووە[١].

مێژوونووسی کورد محەمەد ئەمین زەکی بەگ ئەم فەتحکردنەی بە یەکەمین پەیوەندی کورد بە ئیسلامەوە ئەژمار کردووە[٢]، دوای ئەمە سەرکەوتنی موسڵمانان بەردەوام بوو و شارەکانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیایان، یەك لە دوای یەك فەتحکرد، وەك حلوان و ماسبزان و قرماسین (کرمانشاه) و دەینەوەر لەساڵی (١٦هـ/ ٦٣٧ز). ئەم سەرکەوتنانە بە جەنگی نەهاوەند لە ساڵی (٢٢هـ/ ٦٤٢ز) گەیشتە لوتکە، کە موسڵمانان سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەست هێنا و بەهۆی بایەخی ئەم فەتحەوە لە مێژوودا بە (فتح الفتوح) ناسراوە، دواتر هەمەدان لە ساڵی (٢٢هـ/ ٦٤٢ز) فەتحکرا[٣]. کاتێ بێزەنتییەکان هەستیان بە فشاری فتوحاتی ئیسلامی کرد، هەستان بە کۆکردنەوەی هێزەکانیان، کە لە جەنگاوەرە ڕۆمەکان و هاوپەیمانەکانیان پێکهاتبوو، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی موسڵمانان لە شاری تکریت، هەواڵی ئەم گردبوونەوەیە گەیشتە بەر گوێی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس، بۆیە لەو بارەیەوە بۆ خەلیفە عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) ی نووسی، ئەوەبوو خەلیفە فەرمانیکرد بە دانانی (عبدالله بن المعتم)[٤] وەك

---

(١) البلاذري: فتوح، ص ص٢٩٥-٣٠٢. الدينوري: الاخبار، ص ص ١٥-١٣٣. خليفة بن خياط: تاريخ، ص ص١٢٧-١٥١.

(٢) خلاصة: ص١٢٣.

(٣) البلاذري: فتوح، ص ص٢٩٦-٣٠٢. الدينوري: الاخبار، ص ص١٦-١٣٣. خليفة بن خياط: تاريخ، ص ص١٢٧-١٥١. الطبري: تاريخ، ج٤، ص٣٥.

(٤) هاوەڵێکی مەزنە بەشداری لە جەنگی هەڵگەڕاوەکاندا کردووە، هەروەك

سەرکردەی سوپایەکی پێکهاتوو لە پێنج هەزار جەنگاوەر بۆ هێرش کردنە سەریان لە شاری تکریت لە ساڵی (١٦هـ/ ٦٣٧ز)، ئەوەبوو سەرکەوتن یاوەری موسڵمانان بوو[١]، خەلیفە عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمانی بە سەعد کرد دوای فەتحکردنی تکریت ڕووبکاتە فەتحکردنی موسڵ، ئەویش لە ساڵی (١٦هـ/ ٦٣٧ز) ئەمەی ئەنجامدا.

چەند گێڕانەوەیەکی جیاواز هەیە لەبارەی دیاریکردنی ساڵی فەتحکردنی شارەکە و ئەو جێگایانەی، کە هێزەکانی ئیسلامی لێیەوە پێشڕەویان کردووە[٢]. موسڵمانان سوپایەکیان بە سەرکردایەتی ئەبو عوبەیدەی جەڕاح بۆ فەتحکردنی شام ئاڕاستە کردبوو[٣]، کاتێ

---

سەرکردەی لای ڕاستی سوپای سەعد بوو لە جەنگی قادسیەدا و بەشداری لە فەتحکردنی مەدائیندا کردووە. ابن سعد: الطبقات، ج١، ص٢٩٥. الطبری: تاریخ، ج٤، ص٣٥.

(١) خليفة بن خياط: تاريخ، ج١، ص١٣٤. الطبری: تاريخ، ج٣، ص ص١٣٥-١٣٧. احمد عادل كمال: فتوح الشرق، ص ص١١٩-١٢٢.

(٢) الواقدی: فتوح الشام، ج٢، ص ص١٨٢-١٨٣. البلاذری: فتوح، ص٣٢٣. الطبری: تاريخ، ج٤، ص٣٧. ابن الاثير: الكامل، ج٢، ص ص٣٦٤-٣٦٥. ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص٧١. احمد عادل كمال: فتوح الشرق، ص ص١٢٣-١٣٥. محمود شيت خطاب: قادة فتح العراق والجزيرة، ص ص٣٧٣-٣٧٨. عبدالماجد احمد السلمان: الموصل في العهدين الراشدی والاموی، (الموصل: ١٩٨٥)، ص ص٣١-٣٤.

(٣) البلاذری: فتوح، ص١٧٢. الدينوری: الاخبار، ص ص١٠٧-١٣١. الطبری: تاريخ، ص ص٥٥-٦٠.

هەواڵ بە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) گەیشت کە ڕۆمەکان موسڵمانانیان لە (حمص) گەمارۆ داوە و خەڵکی جەزیرە نامەیان بۆ (هیرەقل ٦١٠-٦٤١ز) ی گەورەی ڕۆم ناردووە و داوای هاوکارییان لێکردووە بۆ دەرکردنی موسڵمانان لەو خاکەی، کە پێشتر دەستیان بەسەردا گرتبوو، عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس (ڕەزای خوای لێ بێت) ی نووسی، کە یارمەتی و پشتیوانی بنێرێت، کاتێ هێزە گردبۆوەکەی بێزەنتییەکان لە ناوچەی جەزیرە گوێبیستی گەیشتنی هاوکاری بوون لە عێراقەوە بۆ موسڵمانان، وازیان لە (حمص) هێنا، ئەوەبوو دواتر ئەبو عوبەیدە توانی شکست بە هێزە سەنگەرگرتووەکانی بێزەنتی لەوێ بێنێ[١].

دوای ئەم سەرکەوتنانە (عیاض بن غنم) لە سەرووی سوپایەکی گەورەوە دەرچوو بۆ فەتحکردنی جەزیرە و توانی یەك بەدوای یەك شارەکانی فەتح بکات[٢]، سەرکەوتنی خێرای موسڵمانان لە جەزیرە هانی سەرکردە (عیاض بن غنم)ی دا بەرەو پێشەوە بچێ بۆ فەتحکردنی چەند ناوچەیەك، کە لە ڕووی کارگێڕی و جوگرافییەوە سەر بە ئەرمینیا بوون[٣]، هەرچی شارەزوورە ئەوە ناوی هەرێمێك و

---

(١) الطبری: تاریخ، ج٤، ص ص٥٠-٥٣. ابن خلدون: تاریخ، ج٤، ص ص٩٥٢-٩٥٣. ابن الجوزی: المنتظم فی أخبار البشر، ج٤، ص٢٢٣.

(٢) البلاذری: فتوح، ص١٨٠. الطبری: تاریخ، ج٢، ص٥٤. ابن الاثیر: الکامل، ج٢، ص٥٣٢. ابن الفقیه الهمدانی: مختصر کتاب البلدان، ص٧٦.

(٣) البلاذری: فتوح، ص١٩٣. الطبری: تاریخ، ج٤، ص ص٥٣-٥٦. ابن الاثیر: الکامل، ج٥، ص٥٣٥.

شارێکە[١]، ناکۆکی هەیە دەربارەی ئەوەی کێ فەتحی کردووە و چۆنیەتی و ساڵی فەتحکردنی، بەڵام (البلاذری) کە تایبەتمەندە بەفتوحات باس لەوە دەکات ئەو کەسەی شارەکەی فەتح کردووە (عتبە بن فرقد السلمی)[٢]یە ، ئەمەش لە ساڵی (٢٠ھ/ ٦٤٠ز)[٣].

(عتبة بن فرقد) بەردەوام بوو لە فتوحاتەکانی و توانی بەشێك لەئازەربایجان فەتح بکات[٤]، دواتر سەرکردە (حذیفة بن الیمان) لە ساڵی (٢٣ھ/ ٦٤٣ز) هەستا بە فەتحکردنی بەشەکەی دیکە[٥].

بڵاوبوونەوەی خێرای ئیسلام لە کوردستان و زۆری ژمارەی ئەو شارانەی، کە لە ماوەیەکی کەمدا بە بەراورد لەگەڵ ناوچەکانی دیکە فەتحکران، بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر ئاشتیخوازی و ڕاستگۆیی موسڵمانان لە مامەڵکردنیان لەگەڵ کورد دا، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك ناوچەی کوردستان لە سەرەتادا ئیسلامیان قبوڵ نەکرد،

---

(١) لە پێشتردا هەرێمی شارەزوور پێناسە کرا.

(٢) (عتبة بن فرقد السلمی): هاوەڵێکە بەر لە جەنگی خەیبەر موسڵمان بووە، بەشدارییەکی گەورەی لە جیهادی دژ بە هەڵگەڕاوەکاندا کردووە، بەشداری لە فەتحکردنی موسڵدا کردووە، دواتر بۆتە والی ئازەربایجان. ابن سعد: الطبقات، ج٤، ص٢٨٩. ابن الاثیر: أسد الغابة، ج٣، ص ص٣٦٥-٣٦٦.

(٣) البلاذری: فتوح، ص٣٢٩.

(٤) دەربارەی پێناسەی ئازەربایجان بڕوانە: پەراوێزی (٢) لاپەڕە (١٤).

(٥) البلاذری: فتوح، ص٣٢١. الطبری: تاریخ، ج٤، ص ص١٣٨-١٣٩-١٢١. ابن الاثیر: الکامل، ج٣، ص٢٧. بۆ پتر زانیاری بڕوانە: حسام الدین علی غالب النقشبندی: اذربیجان، ص ص٦٧-٨٥.

ئەمەش شتێکی ئاسایی بووە، چونکە مرۆڤ دوژمنی ئەو شتەیە کە نایزانێت! کورد لە هێزە داگیرکەرەکانی پێش فتوحاتی ئیسلامی ستەم و چەوسانەوەیەکی زۆریان بینی، بۆیە شتێکی سەیر نییە هەندێك کورد هەڵوێستێکی نەرێیانە لە هەمبەر موسڵمانە فەتحکەرەکاندا بگرنەبەر، بەڵام ئەم هەڵوێستە نەرێنییە هێندەی نەبرد گۆڕانکاری بەسەردا هات و کورد بوونە بەشێکی دانەبڕاوی موسڵمانان و دەوڵەتی ئیسلامی، لەکۆی گشتی بەرگری کورد وەك نموونە ئاماژە بەمانەی خوارەوە دەدەین: لە هەرێمی ئەهواز و فارس دوای شکستی ساسانییەکان لەجەنگی قادسیەدا سەرکردەی ساسانی (هورمزان) بەرەو ئەهواز لەهەرێمی خوزستان ڕایکرد[1]، لەوێوە سوپای کۆکردەوەو ئامادەکاری کرد بۆ ڕێگریکردنی موسڵمانان لە فراوانکردنی فتوحاتیان، بۆیە خەلیفە عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمانی دەرکرد بۆ سەرکردە موسڵمانەکان، تا سنوورێك بۆ کارەکانی هورمزان دابنێن، دوای چەند شەڕێك، موسڵمانان توانیان هورمزان بەدیل بگرن و وڵاتی ئەهواز لەساڵی (٢٣هـ/ ٦٤٣ز) فەتح بکەن[2].

سەبارەت بە فەتحکردنی وڵاتی فارس (سلمة بن قیس الاشجعی)[3] ڕۆیشت: "تا گەیشت بە هاوبەشدانەران (المشرکین)ی کورد و داوای

---

(١) الطبری: تاریخ، ج٤، ص٧٢. ابن خلدون: ج٤، ص٩٦٣.

(٢) البلاذری: فتوح، ص ص٣٦٢-٣٧٤. الطبری: تاریخ، ج٤، ص١٨٣. ابن الاثیر: الکامل، ج٢، ص٤٦.

(٣) (سلمة بن قیس الاشجعی): هاوەڵێکە لە شەڕی کوردانی ئەهواز باسی لێوەدەکرێت، دوای ئەوەی هاتۆتە کوفە. بڕوانە: ابن سعد: الطبقات، ج٦، ص٣٣. الطبری: تاریخ، ج٤، ص ص١٨٦-١٩٠. ابن حجر: الاصابة في تميز الصحابه، ج٣، ص١٤٨.

موسڵمانبوونی لێکردن، ئەوانیش ڕەتیان کردەوە، لەو کاتەدا داوای سەرانەی لێکردن، بەڵام ڕازی نەبوون، بۆیە موسڵمانان شەڕێکی سەختیان لەگەڵ کردن و بەسەریاندا سەرکەوتن"[١].

بەلازەری لەبارەی فەتحکردنی قەڵاکانی فارسەوە ئەمە دەهێنێ: "عومەری کوڕی خەتاب لە ساڵی (٢٢هـ/ ٦٤٢ز) فەرمانیکرد (الجارود العبدی)[٢] بەرەو قەڵاکانی فارس بچێ، کاتێ لە نێوان (جری)[٣] و (شیراز)[٤] بوو لەوێ لە کۆسپێکی شاخاویدا لە هاوەڵەکانی دواکەوت و کەلوپەلەکانیشی پێ بوو، کۆمەڵێك لە کوردان دەورەیان دا و کوشتییان، بۆیە دواتر ئەم کۆسپە بە کۆسپی جارود ناسرا"[٥].

چەندەی زێتر موسڵمانان دەچوونە نێو هەرێمی فارسەوە بەرگری کوردان زێتر دەبوو، کاتێ موسڵمانان هەوڵیاندا فەتحی هەردوو شاری

---

(١) الطبري: تاريخ، ج٤، ص١٨٧.

(٢) (الجارود العبدي): گەورەی هۆزەکەی خۆی (بنی عبدالقيوم) بووە، موسڵمانێکی سەر ڕاست و لەسەر ئایینەکەی ڕشت بووە، لە ساڵی بیست و یەك لە خاکی فارس شەهید بووە. بڕوانە: ابن حجر: الاصابة، ج١، ص٢٢٦.

(٣) (جری): شارێکە لە فارس بیست فرسەخ لە شیراز دوورە. یاقوت: معجم، ج٢، ص١٣١. ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٣٦.

(٤) (شیراز): شارۆچکەیەکی فارسی و شارێکی نوێی ئیسلامییە، لەلایەن (محمد بن قاسم اثقفی) یەوە دروستکراوە، سەر بە هەرێمی ئەستەخرە. الاصطخری: مسالك الممالك، ص٥٠. ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٤٦.

(٥) فتوح، ص٣٨١.



(فسا)[١] و (داربجرد)[٢] بە سەرکردایەتی هاوەڵی پێغەمبەر (سارية بن زنيم الكناني)[٣] بکەن، کوردەکانی فارس رووبەڕوویان بوونەوە و بەم هۆیەشەوە جەنگێکی سەخت ڕوویدا و سەرکەوتن یاوەری موسڵمانان بوو، لەم بارەیەوە تەبەری دەڵێت: "ساریە بن زنیم بەرەو فسا و داربجرد ڕۆیشت، تا گەیشتە سوپاکەیان و چووە سەریان و ئەوەندەی خوا حەزی کرد گەمارۆی دان، پاشان هاوکارییان بۆ هات و گردبوونەوە و کوردەکانی فارس لێیان کۆبوونەوە، ژمارەیەکی زۆری موسڵمانان خڕبوونەوە و بەسەریاندادان و لەیەك لاوە شەڕیان لەگەڵ کردن و خوا تووشی بەزینی کردن"[٤].

لەوەی پێشوو دەردەکەوێ، کە جووڵەی سوپاکانی موسڵمانان بەرەو ناوچە کوردییەکان هەر لە دەسپێکەوە لە شاری جەلەولا لە ساڵی (١٦هـ/ ٦٣٧ز) لە سەردەمی خەلیفە عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) تا دەگاتە کۆتایی لە (دوین)ی شوێنی لە دایکبوونی سەلاحەدینی

---

(١) (فسا): شارێکی قەشەنگی سەر بە ناوچەی (داربجرد)ە، دانیشتوان و بازرگانییێکی زۆری لێیە. ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٣٨.

(٢) (داربجرد): یەکێکە لە ناوچەکانی فارس و شاری زۆر لەخۆدەگرێت. بڕوانە: ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٣٨.

(٣) (سارية بن زنيم الكناني): هاوەڵێکە ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە فەتحکردنی هەرێمی فارس بەتایبەتی ناوچەی داربجرد. الطبري: تاريخ، ج٤، ص ص١٧٨-١٧٩. ابن حجر: الاصابة، ج٣، ص٥٣.

(٤) الطبري: تاريخ، ج٤، ص١٧٨. ابن الاثير: الكامل، ج٣، ص٢٤٤. الكامل، ج٣، ص ص٤٢-٤٣. ابن حجر: الاصابة، ج٢، ص٥٣.



ئەییوبی لە ساڵی (٢٥هـ/ ٦٤٥ز) لە سەردەمی خەلیفە عوسمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خوای لێ بێت)، دە ساڵی تێنەپەڕاندووە، کە زۆرینەی کورد تێیدا بوونەتە موسڵمان!!!

لەمەی پێشوو دەردەکەوێ ئەو ماوە مێژووییە کەمە (دە ساڵ) بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا و دڵنیاکەرەیەوە لەسەر ئەوەی، کە لەزۆربەی ناوچەکانی کوردستان ئیسلام بەشێوەیەکی ئاشتییانە و بەقبوڵکردنی خودی کورد بڵاوبۆتەوە و ئیسلام بە زەبری شمشێر یا وەك خۆدزینەوەیەك لە سەرانە بڵاونەبۆتەوە[١].

شیاوی باسکردنە هەندێك ناوچەی کوردی لە چوارچێوەی ئەو ناوچەیە بووە، کە چەندین دەوڵەتی لە مێژوودا لەسەر دامەزراوە[٢]، هەروەها یەکێك لە دێرینترین شارسانێتییەکانی لەسەر دامەزراوە ئەویش شارستانێتی وڵاتی نێوان دوو ڕووباران (بلاد ما بين النهرين)ە[٣].

کورد بەر لە ئیسلام بۆ ماوەی چەندین سەدەی دوورودرێژ کەوتۆتە ژێر دەستی چەندین هێزی جیاواز لەوانە: ئەخمینییەکان (٥٥٠ - ٣٣١

---

(١) لە یەکێك لە زانکۆکانی کوردستان لە بەشی زانستە مرۆییەکان نامەیەکی ماستەر بەناوی (کوردستان و پرۆسەی بە ئیسلام کردنی کورد) تاوتوێکراوە، لە زۆربەی ئەو بەشانەی کە باسی فتوحات دەکات لەم جۆرە قسانەی تێدایە. هەروەها بۆ نموونە بڕوانە: ملا.ع. کوردی: کوردستان والاكراد، المكتبه التقدمية الكوردية (١٣)، (بيروت: ١٩٩٠)، ص ص ٧٤-٧٥. عزالدين مصطفى رسول: الواقعية في الادب الكوردي، (بيروت: ١٩٦٦)، ص٥٦.

(٢) بڕوانە: ل١٢ی لێکۆڵینەوەکە.

(٣) پێشتر لە پەراوێزی (٣) ی لاپەڕە (٩) لێکۆڵینەوەکە پێناسەی کراوە.

پ.ز) کە دەوڵەتی میدیای کوردی لەسەر دەستی ئەوان ڕووخا[١].

پاشان بۆ ماوەی دوو سەدە کەوتونەتە ژێر دەستی (ئەسکەندەری مەکدۆنی **٣٣٦ - ٣٢٣** پ.ز)[٢] و هاوپەیمانە (سلووقییەکانی **٣١٢ - ٦٤** پ.ز)[٣]، کە ڕەونەقی فیکر و فەلسەفەکەیان وەکو ڕەونەقی فیکر و فەلسەفەی ئێستای ڕۆژئاواییەکانە!

ئێستا ڕۆژئاواییەکان (ئەوروپی و ئەمریکییەکان) شانازی بەوە دەکەن، کە میراتگری ئەو شارستانێتییەن، دوای هاتنیان شارستانێتییەکیان پێکهێنا لە مێژوودا بە شارستانێتی (هلنستی (٣٣٠ - ١٤٧ پ.ز) ناودەبرێ[٤]. دواتر (فرتییەکان ٢٤٧ پ.ز - ٢٢٤ ز) هاتن، کە بەئەشکانییەکانیش ناودەبرێن، هەروەها دەوڵەتە بنەماڵەییەکان (دویلات الطوائف) لە (١٤٧ پ.ز - ٢٢٤ز)، کە بە ڕزگارکەری نەتەوەکانی ناوچەکە لە داگیرکەران دادەنرێن[٥]، ئەم دەوڵەتە لەسەر دەستی ساسـانییەکان (٢٢٤ - ٦٣٨ز) ڕووخا، کە هەستان بە بزاڤێکی نوێکردنەوە لە سەرجەم بوارەکانی ژیان بەتایبەتی ئایینی، دووبارە

---

(١) بڕوانە: طه باقر: مقدمة، ج١، ص ص٥٧٢-٥٨٦. صادق نشأت و مصطفى حجازى: تاريخ ايران، (القاهرة: ١٩٦٠)، ص ص٣٩-٥٥.

(٢) بڕوانە: هارولد لامب: الاسكندر المقدونى، (بغداد: ١٩٦٥)، ص ص٢٠٩-٢٢٥. طه باقر: مقدمة، ج١، ص٥٨٧-٥٩٢.

(٣) بڕوانە: طه باقر: مقدمة، ج١، ص ص٥٩٢-٥٩٩.

(٤) ابراهيم سليمان الكروى و عبدالتواب شرف الدين: المرجع في الحضارة العربية الاسلامية، (الكويت: ١٩٨٧)، ص١٤.

(٥) بڕوانە: طه باقر: مقدمة، ج١، ص ص٥٩٩-٦١٠.

(ئاڤێستای پیرۆز)ی زەردەشتییەکانیان نووسییەوە بەشێوەیەك لەگەڵ پەرەسەندنەکانی ئەو سەردەمە وێك بگونجێت[١]، لە سەردەمی ساسانیدا (مانی ٢١٦ - ٢٧٦ز) وەدەرکەوت[٢]، کە بانگەوازی بۆ دنیا بەکەمگرتن و ژیانێکی پەڕپووتانە (الزهد والتقشف) دەکرد[٣]. دوای ئەو (مەزدەك ٤٦٧ - ٥٢٨ز) هات بە پێچەوانەی ئەو بانگەوازی بۆ بەرەڵایی (الاباحة) لەهەموو شتێکدا دەکرد[٤]. هەندێك لە ناوچە کوردییەکان کەوتنە بن دەستی دەسەڵاتی ڕۆمە بێزەنتییەکان[٥] و ئەرمەنەکان[٦].

شیاوی باسە ئەو هێزانەی، کە ناوچەکانی کوردستانیان بۆ ماوەی چەندین سەدە داگیرکرد، ئایینی ڕەسەن و بنەماگەلی فەلسەفی و شارستانێتی دێرینی خودان، کاریگەری زۆریان لەسەر خاکی کوردستان هەبوو، لەنێو ئەم ئایینانە جوولەکە[٧] و مەسیحییەت

---

(١) ارثر كريستنسن: ايران في عهد الساسانيين، (بيروت: ١٩٨٢)، ص ص٧٢-٨٤.

(٢) م.ن. ص ص١٣٠-١٦٩.

(٣) م.ن. ص ص١٦٩-١٩٦.

(٤) م.ن. ص ص٣٠٢-٣٤٨.

(٥) عبدالقادر أحمد اليوسف: الامبراطورية البيزنطية، (صيدا - بيروت: ١٩٦٦)، ص ص٥٣ - ٦٦.

(٦) فلادمير مينورسكى: الاكراد ملاحظات وانطباعات، (بيروت: ١٩٦٧)، ص ص١٣٥-١٣٧.

(٧) بنيامين بن يونيا التطلى الاندلسى: رحلة بنيامين، ترجمة: عزرة حداد، (بغداد: ١٩٤٥)، ص١٠٦. ارثر كريستنسن: ايران، ص١٤٤.

هەبوون[١]، ژمارەیەکی بەرچاو لە کوردەکان لەسەر ئەم ئایینانە بوون، بەڵام بۆچی بەرەو ئیسلام وەرسوڕان؟ هەروەها بۆچی لە دژی ئیسلام وەرنەسوڕان؟ سەرباری ئەو هەموو ساڵە دوورو درێژە و، سەرباری لاوازی دەوڵەتی ئیسلام لە هەندێ کاتدا و، توانا هەبوونیان بۆ سەربەخۆیی و دەرچوون لە ئیسلام بە سەربەستی!! بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی و دەقگەلێکی زانستی نییە لەدوور و نزیك ئاماژە بەدەرچوونی کورد بکات وەك نەتەوەیەك، بەڵام ئەوەی ڕوویدا بریتی بوو لەوەی، کە ئیسلام بەشێوەیەکی هێمنانە لەنێو نێو دڵ و دەروونی ڕۆڵەکانی کورد جێگیر بوو!

لێرەدا دەپرسین ئایا دەکرێ ناوچەی کوردستان، کە بە پێی هەندێك ئامار ڕووبەرەکەی دەگاتە نزیکەی (٤٥٠٠ کم$^{٢}$)[٢] بە زۆرلێکردن چووبێتە نێو ئیسلامەوە؟

بەم شێوەیە کوردەکان باوەڕیان بە ئیسلام هێنا دوای ئەوەی بەڕاستی بۆیان دەرکەوت ڕێگەی ڕزگاری و سەربڵندی و بەختەوەرییانە.

کورد لەو کاتەی موسڵمان بووە، زیاتر لە هەزار ساڵ بەسەر زەردەشتی بوونیدا تێپەڕ بووە، ئێستاش زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵ بەسەر موسڵمان بوونیاندا تێپەڕیوە، بۆچی دوای ئەم ماوەیە خەڵك لە ئیسلام هەڵنەگەڕایەوە؟ ئایا ئەوان ئێستا ئامادەن واز لەم ئایینە بهێنن سەرباری ئەو پەلامارە

---

(١) ادی شیر: تاریخ کلدو واشور، ج٢، ص ص٤٨-٨٥. البیرابونا: تاریخ البیرابونا (شهداء المشرق)، (بغداد: ١٩٨٥)، ص٤٦. توما المرجی: کتاب الرؤساء، ص ص٢٨-٣٥.

(٢) صلاح عصام أبو شقرا: الاکراد شعب المعاناة، (بیروت: ١٩٩٩)، ص١٧.

سەختانەی دەکرێتە سەریان؟ سەرباری ڕەونەقی ئەو ئایین و هزرانەی کە هەموو ئامراز و هەڵخەڵەتاندنێکی بەردەستیان بەکاردەهێنن بۆ گۆڕینی بیروباوەڕیان؟؟! ئەوەی ئەمڕۆ لە سروشتی کورد بکۆڵێتەوە بۆی دەردەکەوێ زۆربەیان دەستیان گرتووە بە هەقیقەتی ئیسلام بەشێوەیەك، کە وێنا ناکرێ!

بۆیە پێمان وایە بڵاوبوونەوەی ئیسلام بەم خێراییە بەهۆی شمشێر و زۆرلێکردن، یا ترسان لە سەرانە و هەندێ شتی دیکەی پڕوپووچەوە نەبووە، وەك هەندێ کەس وا گومان دەبەن، بەڵکو چەندان هۆکار و ئامراز لە پشت ئەو بڵاوبوونەوە خێرایەی ئیسلام بووە، کە دەکرێ لەمانەی خوارەوەدا کورت بکرێنەوە:

## یەکەم: هۆکارەکانی پەیوەست بە ئیسلام:

ئیسلام ئایینی فیترەت و زگماکی خەڵکە، ئیسلام ئایینی تەواوی پێغەمبەران و نێردراوانە، لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴾[1].

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَٰهِيمَ ۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾[2].

ئیسلام لە بنەڕەتدا مانای خۆبەدەستەوەدانە بۆ خوا لە فەرمانەکانی و قەدەغەکانی لەسەر زمانی وەحی، کاتێ چاکبوون و ڕێکبوونی مرۆڤ

---

١ القران الكريم: سورة ال عمران: (لە ئایەتی ١٩ەوە...).

(٢) القران الكريم: سورة الحج: (الاية ٧٨).



بە خۆبەدەستەوەدان بێت بۆ خوا، ئەوە خوای گەورە هیچ میللەتێکی لە میللەتان فەرامۆش نەکردووە و پەیامبەری بۆ ڕەوانەکردووە:

﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾﴾[1].

ئەگەر ئیسلام لەگەڵ ئایینەکانی دیکەی پێش خۆی لەوەدا کۆك بێت، کە هەموویان سەرچاوەکەیان یەك ئایین و یەك خوایە، بەڵام لەوەدا لێیان جیاوازە، کە کۆتا ئایینە:

﴿وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾[2].

ئیسلام تەنیا کۆتایی ئایینەکانی دیکە نەبووە، بەڵکو تایبەتمەندییێکی خۆی هەیە، کە هیچ ئایینێکی پێشوو نەیبووە، ئەو تایبەتمەندییەش ئەوەیە ئایینێکی گشتییە خوا بۆ سەر پێغەمبەرمان موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ی ناردووە، تا بە هەموو خەڵکی بگەیەنێت، عەرەب و جگە لە عەرەب، ڕەش و سپی، مرۆڤ و جنۆکە، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾﴾[3].

بە پێی ئەم ئەرکە، ئیسلام لە ئایینەکانی دیکە جیاوازە، چونکە ئایینێکە شیاوە بۆ هەموو کات و شوێنێك، بۆ هەموو سەردەمەکان دەگونجێت هەرچەندەی بوارەکانی ژیانی جودا بن.

---

(١) القران الكريم: سورة فاطر: (الاية ٢٤).

(٢) القران الكريم: سورة الاحزاب: (الاية ٤٠).

(٣) القران الكريم: سورة الانبياء: (الاية: ١٠٧).

بیروباوەڕ و شەریعەتی ئیسلام فەزڵی ئەوتۆی تێدایە، کە وا لە مرۆڤ دەکات سوور بێت لەسەر چوونە ناویەوە، ئەوەی دەچێتە ناویەوە ئیسلام هەموو شتێکی پێدەداو، هیچی لێ وەرناگرێت، مرۆڤ ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە خوای گەورەوە دەکات و ڕێگەیەك دەدۆزێتەوە، تا ڕۆژانە پێنج جار لەبەردەمیدا بوەستێت و بەبێ پەردە لێی بپاڕێتەوە، هیوا بۆ ژیانێکی بەختەوەرانە و حەساوە لەم ژیانی دنیایە و دواتر لە ژیانی نەمری و، تا هەتایە لە ڕۆژی دوایی بەدەست دەهێنێ، ئەمەش هیچی تێناچێ تەنیا شایەتومان هێنان و پەیڕەوکردنی شەریعەتی ئیسلام، کە هەمووی خێر و یەکسانی و دادپەروەرییە، لە کاتێکدا پیاوانی ئایینی لەئایینەکانی دیکەدا لە هەموو بۆنەیەکدا سەرانە وەردەگرن[١].

هەروەها عەقیدە لە ئیسلامدا بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا هاتووە، بنەماگەلێکی ڕەسەنی زۆری بۆ خزمەتی مرۆڤ بە گشتی پێشکەش کردووە، جیاوازی کردن لەسەر بنەمای ڕەگەز و ڕەنگی ڕەت کردۆتەوە، بانگەوازی بۆ برایەتی نێوان مرۆڤەکان کردووە و چینایەتی ڕەتکردۆتەوە، نە پێشتر و نە دواتریش بنەماکانی هیچ عەقیدەیەك نەیتوانیوە بەرامبەر عەقیدەی ئیسلام بوەستێتەوە[٢].

خوای گەورە ئیسلامی سووك و ئاسان کردووە لەسەر دڵان و نزیکی کردۆتەوە لە دەروونەکان، بەهۆی ڕوونی و ئاشکرایی و ڕاستگۆییەکەیەوە

---

(١) بۆ پتر زانیاری لەبارەی لێبوردەیی ئیسلام و ڕەتکردنەوەی بۆ ڕەگەزپەرستی و جیاکاری لەسەر بنەمای ڕەنگ بڕوانە: صلاح الدين الايوبي الاسلام والتميز العنصري، (بيروت: ١٩٨١)، ص ص١٤٢-١٤٨-١٧١-١٧٥.

(٢) ارثر كريستنسن: ايران، ص ص١٣٠-١٦٨.

کە هەق گەیشتە بەرگوێی مرۆڤ ڕێگەی خۆی دەکاتەوە بۆ نێو دڵی، ئەگەر لە دڵیدا چەسپا هیچ ڕێگەیەك نییە بۆ دەرچوونی.

بۆیە کاتێ کورد هەستیان بەم مانایانە کرد و ئەمانەیان لە کار و ڕەفتاری ئەو پێشەنگە بەراییانە بە کرداری (عملي) بینی، کە موژدەی ئەم بانگەوازەیان دا، گەیشتنە ئەو باوەڕەی، کە موسڵمانە عەرەبەکان داگیرکەر و دەرەبەگ و ستەمکار نین، ئیتر کەوتنە ژێر کاریگەری ئەم پەیامە نەمرە و باوەڕیان پێهێنا و لە باوەشیان گرت و بڵاویان کردەوە، تا ئێستاش لە بەرگریکەرانی سەختی ئەم ئایینەن.

## دووەم: هۆکارەکانی پەیوەست بە فەتحکەرەکان:

فەتحکەرەکان بە ئەمانەت و ڕاستگۆییەوە ئیسلامیان هەڵگرت، بۆیە نموونەیەکی جوان و ڕێکی ئیسلام و موسڵمانانیان لەو وڵاتانەدا پێشکەش کرد، کە فەتحیان کرد، دەستدرێژیان نەکردە سەر میللەتە بەزیوەکان و مافەکانی ئەوانیان پێشێل نەکرد، بانگخوازی ڕاستەقینەی خوا بوون، ئەمەش وای لە میللەتە بەزیوەکان کرد موسڵمان بن و خۆشیان بوێن و هاوکاریان بکەن و ڕێگەیان پێ بدەن لە خاکی ئەواندا نیشتەجێ بن و پەیوەندی کۆمەڵایەتیان لەگەڵدا ببەستن.

ئیسلام بۆ بڵاوکردنەوەی لە زەویدا ڕێگەی جیاوازی گرتۆتەبەر و لە دەروازەی جیاوازەوە چۆتە نێو دڵانەوە، فتوحات تەنیا یەکێك لە ئامرازەکانی موسڵمانان بووە بۆ کردنەوەی ڕێگای بەردەم ئیسلام، تا بچێتە نێو دڵانەوە، دەروازەی هەرە گەورە وتەی چاك و جوان بووە،



هەروەها دانایی و ئامۆژگاری جوان، کە موسڵمانی باوەڕدار دەیگەیەنێتە کەسی بێباوەڕ، فەزڵی ئیسلام و کرانەوەی دەروازەکانی خێر و هیوا و دڵ ئارامی بۆ ئەو کەسانە ڕوون دەکاتەوە، کە باوەڕی پێ دەهێنن، بۆیە کەسەکە وەڵامگۆی بۆ ئیسلام دەبێ و لە دەروون چاکی و هیوابوونی بە مەزنی بەزەیی و پاداشتی پان و بەرینی خواوە دەچێتە نێویەوە.

پێشەنگی جوان و ڕێکوپێك ڕۆڵێکی بەرفراوانی لە بڵاوبوونەوەی ئیسلامدا هەبووە، موسڵمانی فەتحکەر باوەڕێکی قووڵی بە ئیسلام هەبووە و خاوەن ڕەوشتێکی بەرز بووە، مەرج نییە لە زانستدا کەسێکی شارەزا و کارامە بووبێت، بەڵام ئاکار و ڕەوشتی جوانی و باشی ناوبانگییەکەی و هاریکاریکردنی لەگەڵ کەسانی دی، وای کردووە خەڵك خۆی و ئایینەکەشی خۆش بووێت، بۆیە بەردەوام سەرسام بوونە پێی، تا دڵیان بەرەو ئەو بیروباوەڕە ڕۆیشتووە، کە ئەو باوەڕی پێی هەیە، تا وەك ئەو وابن[١].

## سێیەم: هۆکارەکانی پەیوەست بە کورد:

ئەگەر ئیسلام نەبوایە، هیچ هێزێك نەیدەتوانی کاریگەری بخاتە سەر ئەو ناوچەیە، باشترین شایەتیش بۆ ئەمە ئەو نەتەوانەی، کە پێشتر ئاماژەمان پێدان حوکمی ناوچەکەیان کردووە، خاوەنی ئایین و شارستانێتی جیاواز بوون[٢]، بەڵام دوای هاتنی ئیسلام، چ کاریگەرییەکیان لەسەر کورد بەجێما؟

---

(١) أبو الحسن الندوی: ماذا خسر العالم، ص ص٥٦-٥٨.

(٢) بڕوانە: ل٧ ی لێکۆڵینەوەکە.

کاتێ موسڵمانان لە دوورگەی عەرەبییەوە هاتن هەموو شتێك لەبارەیانەوە نامۆ بوو، خوێنیان ئەو خوێنە نەبوو، زمانیان ئەو زمانە نەبوو، داب و نەریتیان ئەو داب و نەریتە نەبوو، بۆیە لەم بارەیەوە هیچ شتێك نەبوو، کە سۆزیان بۆ بزاڤی ئیسلام بجزوێنێ و لێی نزیك ببنەوە.. لەگەڵ چەند هەڵاواردنێك لە حیرە و شام، کە جۆرێك لەنزیکایەتی لە نێوان ئێرانییەکان و ڕۆمەکان و عەرەبەکاندا هەبووە[١]، لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی کورد لە ناوچە شاخاوییەکاندا نیشتەجێ ببوون، کە سروشتێکی دڵفرێن و ئاوی زۆر و ئارامی تێدایە.. ئەمەش کاریگەری کردۆتە سەر دەروونیان، جگە لە شتی چاك، بە هیچ شتی دی ڕازی نەبوونە، بۆیە هاتنە نێو ئیسلامەوە، سەرباری ئەمانە کورد بێزار و وەڕز بوون لە خراپی و تێکچوونی بارودۆخی ناوچەکەیان لەگشت بوارەکاندا[٢].

سیستەمی باوی ئەو ناوچەیەی، کە ساسانییەکان بەسەریدا زاڵ بوون، خاوەندارێتی ڕەها بوو، کیسراکان پاشایانی ساسانی بانگەشەی ئەوەیان دەکرد، کە خوێنێکی خوایی لە دەمارەکانیاندا هەیە، دانیشتوانی دەوڵەتەکە وەك خواوەند سەیریان دەکردن و پێیان وابوو ئەوان لە سەرووی یاسا و ملکەچبوون و لە سەرووی مرۆڤەوەن، ئەو پارە و سامان و کەمە نیعمەتەی خۆیان، کە دەیبەخشنە خەڵکی، تەنیا خێر و پیاوەتییە

---

(١) محمود شيت خطاب: قادة فتح العراق والجزيرة، ص ص١٣-٢٢. أحمد عادل كمال: الطريق الى دمشق، ص ص٢١-٣٣.

(٢) بڕوانە: الدينوري، الاخبار، ص ص٧٠-٧٨-٨٢-٨٤-٨٩-١٠٤. أبو الحسن الندوي: ماذا خسر العالم، ص ص٥٦-٥٨.



بەبێ ئەوەی مافی خۆیان بێت، لە بەرامبەردا خەڵکی هیچیان بۆ نییە تەنیا ئەوە نەبێ گوێڕایەڵی و ملکەچی نیشان بدەن، ئەم مافەش لە گەورەیەکەوە بۆ گەورەیەکی تر و لە باپیرەوە بۆ باوك دەگوازرێتەوە، بە بۆچوونی دەسەڵاتدارەکانیان، تەنیا کەسێکی ستەمکار داوای ئەو مافەی ئەوان دەکات و ئەوەشی کێبەرکێیان لەگەڵدا بکات، جگە لە کەسێکی بیژوو و سووك و ڕیسوا هیچی تر نییە[1]، هیچ کاتێ بەخەیاڵیاندا نەهاتووە، کە گەورەیەکیان، یا یەکێك لە سەرکردەکانیان بکەنە پاشای خۆیان، ئەگەر لە بنەماڵەی پاشایەتی نەبووبێت[2].

ئایینیان زەردەشتی و کتێبی پیرۆزیان (ئاڤێستا) بووە، باوەڕیان بە دوو خواوەند هەبووە: خواوەندی چاکە و خواوەندی خراپە، ئاگریان پەرستووە و ئەو کارانەیان حەڕام کردووە، کە پێویستی بە ئاگر هەیە، بۆیە دەبوو تەنیا لە بواری جووتیاری و بازرگانی کار بکەن، بە پێی ئەم ئایینە سیستەمی ستەمکارانەی چینایەتی بەسەر کۆمەڵگەدا سەپێندراوە[3]، شتێکی ئاساییە، کە ئەمە ناکۆکە لەگەڵ بیروباوەڕی ڕاست و دروست.

ئاگر نە شەریعەتێکی پێیە بۆ ئەوانەی دەیپەرستن، نە پێغەمبەرێکیش ڕەوانە دەکات، دەرئەنجامەکەی بێبەشبوونی ژیانی دانیشتوانی دەوڵەتی

---

(١) الطبری: تاریخ، ج٢، ص٨٥.

(٢) مفید رائق محمود: معالم تاریخ الدولة الساسانیة، (بیروت: ١٩٩٣)، ص ص٩٤-٩٥. ارثر کریستنسن: ایران، ص ص٨٥-٨٦.

(٣) ارثر کریستنسن: ایران، ص ص١٣٠-١٦٧.



ئێرانییە لە ئایینێکی قووڵ و کۆکەرەوە، کە هاندەر بێت بۆ پارێزکاری (التقوی) و کردەوەی چاکە و ببێتە سیستەمێك بۆ خێزان و ڕێکخستنی ماڵ و، سیاسەتی دەوڵەت و دەستوری ئوممەت، ببێتە بەربەستێك، تا پاشاکان و دەسەڵاتداران ستەم و زۆرداری دەرهەق بە خەڵك نەکەن، دەستی ستەمکار بگرێت و ماف بۆ ستەملێکراو بگێڕێتەوە، هیچ جیاوازییەك لەنێوان پەیڕەوکارانی ئایینی زەرەشتی و ئیباحییەکان لەڕووی ڕەوشت و کارکردنەوە نەبوو[١].

کۆمەڵگەی ساسانی لەسەر بنەمای ڕەچەڵەك و پیشە دامەزراوە - وەك لە پێشتر ئاماژەمان پێدا -، لە ڕێساکانی سیاسەتی ساسانی ئەوەبوو، هەر کەسە و بەو ناوەندە ڕازی بێت، کە ڕەچەڵەکەکەی پێی بەخشیوە و، مافی ئەوەی نییە لەوە زیاتر بەسەرکەوێ، ئەم سیستەمە ستەمکارییە لە ئایینی زەردەشتیدا چەسپێندراوە، پاشا ساسانییەکان هیچ پیشەیەك لە پیشەکانی دەوڵەتیان نەدەبەخشیە کەسێکی ئاسایی، دەبوو ئەو کەسە لە بنەماڵەی خۆیان بێت، خەڵکی گشتیش چەندین چینی لەیەکتر جیاواز بوون و بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا جیاکاریان تێدا دەبینرا[٢].

ئەم جیاوازییەی نێوان چینەکانی کۆمەڵگە، سووکایەتی کردن بوو بە مرۆڤایەتی، ئەمەش بەڕوونی لە دانیشتنگەکانی میر و خانەدانەکان

---

(١) بڕوانە: الدینوری: الاخبار، ص ص٨٩-١٠٤. أبو الحسن الندوی: ماذا خسر العالم، ص ص١٠٩-١١٠. ارثر کریستنسن: ایران، ص ص٨٤-١٢٠.

(٢) بڕوانە: الدینوری: الاخبار، ص٦٦. أبو الحسن الندوی: ماذا خسر العالم، ص ص١٠٢-١٠٣.

دەردەکەوت، کاتێ خەڵکی وەکو شتێکی بێ گیان و بێ جووڵە لە پشت میرەکان وەك پاسەوان ڕادەوەستان و دواتر لەوپەڕی خۆبەکەمزانین لە دانیشتنگەکەدا دادەنیشتن(١).

سیستەمی دارایی و سیاسەتی دارایی لە ئێران دادپەروەرانە و جێگیر نەبوو، بەڵکو لە زۆربەی کاتدا زۆردارانە و شڵەژاو بوو، بەسترابۆوە بە ڕەفتار و هەواو هەوەسی باجگرەکان و هەلومەرجی سیاسییەوە، لە هەندێ کاتدا کە جەنگ بەرپا دەبوو و دەوڵەتیش پارەی نەبوو بۆ جەنگەکە خەرجی بکات، پەنای دەبردە بەر سەپاندنی باجی نوێ، بەردەوام کەرتەکانی ڕۆژئاوا - کە ناوچەی کوردی لەم چوارچێوەیەدا بوو - ئامانجی ئەم باجانە بوون(٢). لە سەرووی هەموو ئەمانەوە نافارسەکان دەیاننالاند بەدەست - ئەوەی ئێستا پێی دەڵێین- جیاکاری ڕەگەزایەتی، هەروەك زێدەڕۆییان لە شکۆدارکردنی نەتەوەی فارسدا دەکرد و لایان وابوو فەزڵی بەسەر هەموو ڕەگەز و نەتەوەکانی دیکەوە هەیە(٣)، سەرباری ئەمە دەوڵەتی ساسانی چووە نێو چەندین جەنگی ناوخۆیی و دەرەکییەوە، هاوڵاتیانی جگە لە کاولکاری و کوشتن هیچی تریان بۆ نەمایەوە(٤).

---

(١) ارثر كريستنسن: ايران، ص ص١١٠-١٢٩. أبو الحسن الندوي: ماذا خسر العالم، ص١٠٨.

(٢) ارثر كريستنسن: ايران، ص ص٧٢-٨٥-١٩٦-٢٤٥.

(٣) أبو الحسن الندوي: ماذا خسر العالم، ص٦٢.

(٤) ارثر كريستنسن: ايران، ص ص٧٢-٧٨-٢٤٣.

بەم شێوەیە هیچ لایەنێك لە لایەنەکانی ژیان لە کۆمەڵگەی ساسانیدا - کە کوردیش بەشێك بوو لێی - نەبوو ئەگەر ستەمکاری و زۆرلێکردن و بێبەشکردنی تێدا نەبووبێت. بارودۆخی ئەو کوردانەی، کە لەژێر سایەی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتیدا دەژیان لە بارودۆخی ئەوانەی لەژێر دەستی فەرمانڕەوایی ساسانییەکاندا دەژیان باشتر نەبوو(١).

لەبەر ئەوە کاتێ کورد ئیسلامی ناسی و بە کردار لە موسڵمانە فەتحکەرەکانیدا بینی، زۆربەیان هاتنە نێو ئیسلامەوە. ئەگەر فتوحاتی ئیسلامی پەلامارێکی سەربازی بوایە لەلایەن عەرەبە موسڵمانەکانەوە، یا داگیرکاری عەرەب بوایە بۆ کورد - وەك هەندێك وا گومان دەبەن - ئەمە پێویستی بە یارمەتی و پشتوانییەکی زۆری هێزە ئیسلامییە عەرەبییەکان دەبوو، تا بتوانن لەڕووی سەربازییەوە کۆنترۆڵی ناوچە کوردییەکان بکەن، بەو واتایەی هەبوونی ژمارەیەکی زۆری جەنگاوەران بەشێوەیەك لەگەڵ قەبارەی کورد دا بگونجێت، کە لە دۆڵە قووڵ و دەشتە بەرفراوانەکان و چیا سەرکەشە زۆرەکاندا بڵاوبوونەتەوە، کەواتە ناکرێ لەڕووی سەربازییەوە لە هیچ شارێك لە شارەکانی کوردستان تێپەڕ بن و بچنە شارێکی دیکە، مەگەر هێزێکی سەربازی گەورە لە شاری یەکەم بەجێبهێڵن بۆ پاراستنی لە هەر جوڵانەوەیەکی یاخی بوون، ئەمەش پێویستی بەوە هەیە بەردەوام پاڵپشتی سەربازی لەڕووی ژمارە و کەرەستەوە بوونی هەبێت، ئەمەش سەرچاوە مێژووییەکان

---

(١) ادوارد جیبون: اضمحلال الامبراطوریة الرومانیة وسقوطها، (د. ط) (د. ت)، ج١، ص ص٢٠٥-٢٤٨-٥٢٩. أبو الحسن الندوی: ماذا خسر العالم، ص ص٩٨-٩٩. عبدالقادرأحمد الیوسف: الامبراطوریة البیزنطیة، ص ص٥٣-٦١.

ئاماژەیان پێنەداوە، هێزە فەتحکەرەکان لەگەڵ دانیشتوانی شارە فەتحکراوەکاندا تێکەڵ بەیەکتری دەبوون و دەبوونە بەشێکی دانەبڕاو لێی، تەنانەت لە زۆرێك لە شارەکانی کوردستان جەنگاوەری کورد دەچووە پاڵ جەنگاوەری عەرەبی موسڵمان، لەپاڵ یەکتری کاریان دەکرد بۆ بەرگریکردن لە شارە کوردییەکان و بەردەوامبوونی فتوحات لە شارەکانی دیکەدا، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە ئایا چ هێزێك لە جیهاندا دوژمنەکانی لەدوای خۆی بەجێدەهێڵێت؟! ئەگەر لێیان دڵنیا نەبێت! پاشان دەست بکات بە بڵاوبوونەوە لە پشت ئەوانەوە، ئا ئەمە لە ناوچە کوردییەکاندا ڕوویدا، کاتێ ئەو ناوچانە فەتح کران یەکسەر موسڵمانان دەستیانکرد بە فتوحاتی دوای ئەوە[١].

ئەگەر ئەمە مانایەك بدات بەڵگەیە لەسەر ئەوەی فەتحکەرەکان دڵنیابوونە لە ئیسلامەتی کورد، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو کورد لەگەڵ برا موسڵمانە عەرەبەکانیان بەشداریان کردووە لە بەرگریکردن لە پاوانی ئیسلام دژ بە هێرشەکانی ڕۆمە بێزەنتی و ئەرمەن و خەزەرەکان، بەشدارییان لە فتوحاتدا کردووە بەتایبەتی لەو وڵاتانەی ڕاستەوخۆ دەکەونە ئەو دیو ناوچەیەی، کە کوردی تێدا نیشتەجێیە[٢].

سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژەیان بە یاخیبوون، یا پەلامارێکی چەکداری دژ بە ئیسلام و ئەو موسڵمانانە نەکردووە، کە لە دەرەوەی

---

(١) اليعقوبي: تاريخ، ج٢، ص٤٩٦. الطبري: تاريخ، ج٩، ص٢٦١. ابن الاثير: الكامل، ج٥، ص٣١٣. مسكوية: تجارب الامم، ج٦، ص٥٦٠.

(٢) البلاذري: فتوح، ص ص١٩٣-٣٠٤-٣٢٦-٣٩٠. ابن أعثم: الفتوح، ج٢، ص ص٦٢-٦٨.

کوردستانەوە هاتوون، ئەگەر ئیسلام لەڕێگەی فشار و زۆرلێکردنەوە هاتبێتە نێو کوردستان، پەرچەکرداری سەربازی و فیکری و سیاسی ڕوویدەدا، هەروەها سەرچاوە مێژوویی، یا ئەدەبی، یا جگە لەم سەرچاوانە دەقگەلی مێژوویی، یا قەسیدە و بەیتی شیعری دەختە بەردەستمان و ئەمانەی تێدا تۆمار دەکرد، جا چ بەشێوەیەکی نەرێنی، یا ئەرێنی بوایە.. ئەوەی لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هەیە ئاماژەدانە بەوەی کورد دوور لە هەموو جۆرە فشار و کاریگەرییەکی دەرەکی دەستی بە ئیسلامەوە گرتووە، ئەمەش لەگەڵ نیگای قورئانی دەسازێت وەك تێیدا هاتووە:

﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ﴾ [1].

ئەگەر ئیسلام لە ڕێگەی فشار و زۆرلێکردن، یا بەهۆی کاریگەری عەرەب بڵاوبووبێتەوە، ئەمە کاتێکی دوورودرێژی دەخایاند، ئەو کات (زمن)ە بە چەند دەخەملێنرێ، کە پێویست بوو بۆ عەرەب، تا فێری زمانی کوردی و شێوەزارە ناوخۆییەکانی بێت؟ چەندە کاتی دەویست، تا زاڵ بن بەسەر دەشتە پان و بەرینەکانی و قووڵایی دۆڵ و شیوەکانی؟ سەرکەوتن بەسەر چیا سەرکەشەکانی و ناوچە دووردەستەکانی و گوندە زۆرەکانی.. چەندە کاتی دەویست؟

لەگەڵ سەرنجدان لە بڵابوونەوەی خێرای ئیسلام، پێمان وایە بازرگانی و بانگخوازان و هۆکارگەلی دیکە، کە دەتوانین ناوی بنێین

---

(١) القران الكريم: سورة البقرة: (الاية ٢٥٦).

بە هۆکارگەلی ناڕاستەوخۆ، کە لێرەدا ناکرێ ئاماژەیان پێ بدەین، ڕۆڵێکی کارایان لە بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەنێو کوردا دا هەبوو بەر لە گەیشتنی فتوحاتی ئیسلامی[١]، دوای ئەمە کوردەکان هەستان بەگواستنەوەی ئیسلام بۆ شاخەکان و گوندە دووردەستەکانی کوردستان بە شێواز و زمانی خۆیان، ئەمەش لە توانای موسڵمانێکی عەرەبدا نەبوو بەم خێراییە ئەنجامی بدات، بەڵگەی ئەم واقیعە زیندووەی کارلێکی نێوان فەتحکەرەکان و گەلانی بەزیو ئەوەیە وەك (جۆلیان) ئاماژەی پێداوە، کە دەڵێ: " فەتحکەرەکان بازدانێکی بێ وێنەیان تۆمار کرد، کە هاوشێوەی لە مێژوودا ڕووینەداوە، سنوور و بەربەستەکانیان تێکشکاند و شۆڕشی فەڕەنسی و ڕوسی لەچاو ئەودا زۆر سادە و ساکارن، فەتحکەرەکان و دانیشتوانە ڕەسەنەکان لە یەکێتییەکی بەهێز و هەتا هەتایی یەکیان گرت"[٢].

---

(١) بۆ نموونە بڕوانە: عبدالله مصطفی: أمجاد الاكراد، مخطوطة غير منشورة فی جامع الشيخ مصطفی النقشبندی، ص ص٤٥-٤٨. البدليسی: شرفنامة، (اربيل: ٢٠٠١)، ص٨٩. بەدلیسی لە گێڕانەوەیەکدا باس لەوە دەکات، کە (ئۆغۆزخان) ی پاشای تورکستان شاندێك بە سەرکردایەتی کەسایەتی و گەورە پیاوێکی کورد بەناوی (بەغەدوز) بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە شاری مەدینە دەنێرێت، ئەم پیاوە کوردە کەسێکی بە دیمەن ناشیرین و دڵڕەق و جەستە بەهێز و زەبەلاح بووە، بۆیە پێغەمبەر کاتێ ئەمەی بینیوە لێی بێزار بووە و دوعای لە کوردان کردووە، کە قەت یەکگرتوو و تەبا نەبن لەنێو خۆیاندا، چونکە ئەگەر یەکبگرن لەسەر دەستی ئەوان جیهان کاول دەبێ. بڕوانە: البدليسی: شرفنامە، ص٦٢. ئەم گێڕانەوەیەی بەدلیسی بەم شێوە و ناوەڕۆکەوە هیچ ئەسڵێکی نییە، بەتایبەتی بەدلیسی ئاماژەی بەو سەرچاوەیە نەکردووە کە ئەم زانیارییەی لێوەرگرتووە، سەرباری ئەوەش ئەم گێڕانەوەیە بەم شێوە نازانستییە بڵاوبۆتەوە! (توێژەر).

(٢) شارك اندری جوليان: تاريخ افريقيا الشمالية، (تونس: ١٩٧٨)، ص٩٢.

لێرەدا سەرنجێکی سەرەکی هەیە، کە پێویستە کورد ئاگاداری بێت: ئەویش ئەوەیە هەوڵدان بۆ جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی ئیسلام بەزۆرلێکردن و کاریگەری زۆرەملێی عەرەب لە کوردستاندا بڵاوبۆتەوە، ئەمە لە خۆیدا سووکایەتی کردنە بە داب و نەریتە ڕەسەنەکانی کورد و پیاوەتی و جوامێری و هێز و سروشتی وڵاتەکەیان، بە مانایەکی دی هەندێك لەوانە دەیانەوێ ئەوە بگەیەنن، کە کورد لاواز و بێ ئیرادە بوون و، بەشێوەیەکی گشتی لە بەرامبەر هێزەکانی ئیسلامی شکستخواردوو بوون، فیترەتی ڕەسەنی کوردی هەموو ئەمانە ڕەتدەکاتەوەو پیاوەتی و جوامێری کورد بە سەرشۆڕی ڕازی نابێ و ئەوە ڕەتدەکاتەوە خۆبەدەستەوە بدات بۆ بێگانەیەکی داگیرکەر، هیچ سەرچاوەیەکیش ئاماژەی بەمە نەداوە.

کورد بەدرێژایی مێژوو هێز و ڕەسەنایەتی خۆیان پاراستووە بۆ بەرگریکردن لە مافەکانیان، هیچ کاتێ لە بەرامبەر ئەو داگیرکەرانەی پێیان ڕازی نین دەست بەستراو نەوەستاون، بە پێچەوانەی فەتحکەرە موسڵمانەکان، کە لە ئایینەکەیانەوە ڕاستگۆیی و برایەتیان لەگەڵ عەرەب دەستکەوت، بەبێ ئەوەی لە داب و نەریتیان کەم بکاتەوە، خوای گەورە دەفەرموویێت:

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ﴾[1].

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموویێت: "لا فرق بين عربی وأعجمی الا بالتقوی"، کە بەشێوەیەك کورد لە پاڵ عەرەبدا لە بۆتەی ئیسلامدا توانەوە و شانبەشانی یەکتری کاریان کرد، بەبێ ئەوەی

---

(١) القران الکریم: سورة الحجرات: (الایة ١٠).

یەکێکیان خۆی بە بەرزتر بگرێت بەسەر ئەوی دیکەیاندا، ئەمەش بۆ خزمەتکردنی شارستانێتی نوێ و دەوڵەتی نوێ بوو.

ئەوانەی لە شیکردنەوەی بڵاوبوونەوەی خێرای ئیسلام لەنێو کورد و گەلانی دی ناگەن، زێتر ئەوە دەوروژێنن، کە سەرانە هۆکاری سەرەکی هاتنیانە بۆ نێو ئیسلام، چونکە نەیاندەتوانی بیدەن، سەرانە ئەو بڕەیە کە لە (ئەهلی زیممە) وەردەگیرێت لە بەرامبەر بەڵێندانی موسڵمانان بەپاراستنی گیان و ماڵ و سامانیان و لە بەرامبەر بەخشینیان لە خزمەتی سەربازی، سەرانە لەسەر نێرە عاقڵ و پێگەیشتووەکان پێویستکراوە، کە توانایان هەیە، لەسەر منداڵ و ژن و بەساڵاچوو و ڕاهیب و نەخۆش و کوێرەکان پێویست نییە، دار خورما و دار مێو و وەرزێری و ماڵ و ماڵاتیان سەدەقەی لەسەر نییە، نەك هەر ئەوە، بەڵکو ئەوانەشی ناتوانن سەرانە بدەن لەسەریان لادەچێ، ئەم سەرانەیە زۆر لەوە کەمتر بوو، کە ساسانی و ڕۆمانەکان لە هاوڵاتیانی خۆیان وەردەگرت و تەنیا کەسە نزیکەکانی دەوڵەت لە سەرانە دەبەخشران.

هاتنی خەڵکی بۆ ناو ئیسلام بەهۆی سەرانەوە هەڵبەستراوێکی چرووك و لاوازە، کە لە بەرامبەر سادەترین هەقیقەتی مێژووییدا خۆی ناگرێت، ئەمەش ستەم و سووکایەتییەکی دیکەیە دەرهەق بەو گەلانە و مێژوویان، کە هاتوونەتە ناو ئیسلام، ئیسلام دەسەڵات نەبووە، کە سەرانەی وەرگرتبێت، سەرانە یاسایەك بووە لای هەموو گەلان بەجوولەکە و نەسرانییەکانیش، پەیمانی کۆن (تەورات)، کە جوولەکە و نەسرانییەکان باوەڕیان پێی هەیە یاسای سەرانە تێدایە و باس لەوە دەکات: پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) کاتێ هەندێك وڵاتیان

دەست بەسەردا گرتووە سەرانەیان لە میللەتە بەزیوەکان وەرگرتووە، هەروەك پێغەمبەر یوشەع (سەلامی خوای لێ بێت) ئەوەی لەگەڵ کەنعانییەکان ئەنجامدا، ئەوان لە گەلانی ناوچەی وڵاتی شام بوون، کاتێ بەسەریاندا سەرکەوت نەك تەنیا سەرانە، بەڵکو کۆیلایەتیشی بەسەردا سەپاندن.

پەیمانی نوێ (ئینجیل) ی مەتا باس لەوە دەکات پرسیار لە مەسیح (سەلامی خوای لێ بێت) کراوە: "ئایا دروستە سەرانە بەقەیسەر بدرێت، یاخود نا؟ پێی گوتن: ئەم وێنە و نوسینە - کە لەسەر پارەکەیە - هی کێیە؟ پێیان گوت: هی قەیسەرە، پێی گوتن: کەواتە ئەوەی هی قەیسەرە بیدەن بە قەیسەر، ئەوەی هی خواشە بیدەن بەخوا". سەرانەدان بە سوڵتانەکان لای نەسرانییەکان بە مافێکی ڕەوا دادەنرێ، تەنانەت پیرۆزی پێدەبەخشن و وەك فەرمانێکی ئایینی لێی دەڕوانن.

کاسۆلیك، کە گەورەترین تائیفەی ئایینی مەسیحین و ناوەندەکەیان دەکەوێتە شاری ڤاتیکان، بارەگای پاپا، سەرانەیان بەسەر ئەرسەدۆکسەکاندا دەسەپاند، کە تائیفەیەکی بچووکتری ئایینی مەسیحی بوون لە میسر، بەر لەوەی موسڵمانانان فەتحی بکەن، لەوان گوێبیست نەبووین بڵێن ئەرسەدۆکسەکان لە ترسی سەرانە وازیان لە تائیفەکەی خۆیان هێنا و چوونە نێو کاسۆلیکیەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە هونەرکاری لە باسکردنی ئارامگرتن و خۆڕاگری ئەرسەدۆکسەکان لەسەر بیروباوەڕیان و ڕاکردنیان بۆ بیابان و ئەشکەوتەکان دەکەن و، باس لەوە دەکەن ئەوان مردنیان پێ باشتر بوو لە وازهێنان لە تائیفەکەیان.

هەروەها نەسرانییەکان حیکایەتی دووروودرێژیان لەبارەی قارەمانێتی خۆیانەوە نووسیوە لە ڕووبەڕووبوونەوەی سەردەمی (شەهیدبوون) کاتێ ڕۆمانەکان فڕێیان دەدانە بەردەم شێری برسی و لە گۆڕەپانەکاندا دەیانسوتاندن و، لەژێر پێی بتەکانیانەوە سەریان دەبڕین، لەگەڵ ئەوەشدا گوێبیستی ئەوە نەبووین کەسێکیان لە ئایینەکەی پاشگەز بووبێتەوە، بەڵام کاتێ دەستەوسان بوون لە بیانووهێنانەوە بۆ هاتنی نەسرانی و جوولەکەکان بۆ نێو ئیسلام بە ڕەزامەندی و قەناعەتی خۆیانەوە، لەئیسلامدا شێری برسی، یا ئاگرێکیان نەدۆزیەوە، کە بەرهەڵستکاران بسووتێنێ، بۆیە هەوڵیاندا بیانوو بۆ ئەم فەتحە مەزنە بە سەرانە بهێننەوە، ئەمانە ئەوەیان لەبیر کردووە، کە سەرانە لەهەموو مێژووی ئیسلامدا لە چوار دینار زیاتر نەبووە، لە زۆربەی کاتدا لەنێوان دینارێك، یا دوو دیناردا بووە، لێرەدا بەڵگە بە قسەی مێژوونووسە ڕۆژئاواییەکانی خۆیان دەهێنینەوە:

مێژوونووسی جوو (بنیامین) نووسەری کتێبی (رحة بنيامين التطيلي) دەڵێ: "جووەکان لە هەموو وڵاتی ئیسلامدا یەك دیناریان دەدا".

ویل دیورانت لە ئینسکلۆپیدیایەکەیدا (قصة الحضارة) دا شایەتی دەدا و دەڵێ: "ڕاهبەکان و ژنان و ئەو نێرانەی نەگەیشتوونەتە تەمەنی باڵق بوون، کۆیلەکان و بەساڵاچوان و پەککەوتەکان و کوێرەکان و زۆر هەژارەکان لە سەرانە بەخشرابوون".

مۆنتسکیۆ لە کتێبەکەیدا (گیانی یاساکان) زیاتر لەمە ڕووندەکاتەوە و پێی وایە سادەیی و کەمی سەرانە بۆتە مایەی خێرابوونی بڵاوبوونەوەی

فتوحاتی ئیسلامی، بۆیە دەڵێ: "ئەو سەرانەیەی دەسەپێنرا هۆکارێك بوو بۆ ئەو ئاسانکارییە سەیرەی، کە موسڵمانەکان لەکاتی فتوحاتدا ڕووبەڕووی دەبوونەوە، میللەتان پێیان وابوو - لەجیاتی ملکەچکردن بۆ ئەو زنجیرە سەرانە کۆتا نەهاتووەی، کە ئیمپراتۆرەکان عەوداڵ و شەیدای بوون و لە ئەندێشەی خۆیاندا سووربوون لەسەری- ملکەچی دانی سەرانەیەکی سووك بن، کە دەکرێ بە ئاسانی بەدەستبخرێت و بە ئاسانی ڕادەست بکرێت".

مێژوونووس (تۆماس ئارنۆڵد) لە کتێبەکەیدا (بانگەواز بۆ ئیسلام) دەڵێ: "مەبەست لە سەپاندنی ئەو باجە بەسەر مەسیحییەکان چەشنێك لە چەشنەکانی سزا نەبوو لە بەرامبەر قبوڵنەکردنی ئیسلام، بەڵکو ئەوان لەگەڵ هەموو ئەهلی زیممە دەیاندا، ئەهلی زیممەش ئەو کەسانە بوون، کە موسڵمان نەبوون و هاونیشتیمانی دەوڵەت بوون و لە خزمەتی سەربازی بەخشرابوون، سەرانەیان لە بەرامبەر ئەوەدا لێوەردەگیرا، کە سەر و ماڵیان لەلایەن موسڵمانانەوە دەپارێزرا". خالیدی کوڕی وەلید بۆ ناوچەکانی سەر بە هەرێمی عێراقی نووسی: "ئەگەر توانیمان بتانپارێزین، ئەوە دەبێ سەرانە بدەن، ئەگەر نەشمانتوانی بتانپارێزین ئەوە سەرانە مەدەن، تا ئەو کاتەی دەتانپارێزین".

ئیسلام ئەوەی فەرز کردووە کە: "پێویستە لەسەر پێشەوای موسڵمانان: ئەهلی زیممە بپارێزێت و ڕێگری بکات، لە ئەزیەتدانیان، گیراوەکانیان ئازاد بکات و لەو کەسانەیان ڕزگار بکات کە دەیانەوێ ئەزیەتیان بدەن".

ئەمەش قسەی ئەو کەسانە بەدرۆ دەخاتەوە، کە دەڵێن: خاوەن پەیامەکان (اهل الکتاب) بەهۆی سەرانەوە چوونەتە نێو ئیسلامەوە،

هەروەها ڕۆشنایی و دادپەروەریتی و بەزەیی ئیسلام دەردەخات و هۆکاری ڕاستەقینەی هاتنی ملیۆنان کەس بۆ نێو ئیسلام بۆ هەموان ئاشکرا دەکات.

ئەو کەسانەی کە دەڵێن خەڵك لەبەر سەرانە بوونەتە موسڵمان، سووکایەتییەکی دیکە بە خاوەن پەیامەکان بەگشتی و کورد و مێژووەکەی بەتایبەتی دەکەن، چۆن دەبێ کەسێك لە بەرامبەر دانی چەند دینارێکی کەم لە ساڵێکدا واز لە ئایینەکەی خۆی بهێنێت؟ ئەمە لە کاتێکدا ئەوەی دەچێتە نێو ئیسلامەوە بڕێکی زیاتر لە بڕی سەرانە دەدات، وەکو زەکات و سەدەقەکردن، بەشداری لە خزمەتی سەربازیدا دەکات کە لەڕووی مادییەوە زیانی زۆر زیاترە لەو بڕەی، کە وەك سەرانە دەیدات.

# ناوەڕۆك

پێشەکی.................................................................. ٥
فەتحکردنی ناوچەکانی کوردستان.......................................... ١٦
یەکەم: هۆکارەکانی پەیوەست بە ئیسلام:.................................. ٢٩
دووەم: هۆکارەکانی پەیوەست بە فەتحکەرەکان:........................... ٣٢
سێیەم: هۆکارەکانی پەیوەست بە کورد:.................................... ٣٣

# بڵاو بوونەوەی **ئیسلام**
# لە کوردستان

بابەتی بڵابوونەوەی ئیسلام لە کوردستاندا یەکێکە لە بابەتە گرنگەکان لەسەر ئاستی مێژوویی و سیاسیی، توێژەر هەوڵیداوە ئەو هۆکارە ڕاستەقینانە دەربخات کە بوونەتە هۆی خێرا بڵابوونەوەی ئیسلام لە کوردستاندا •

توێژەر ئاماژەی بەوە داوە کە جووڵەی سووپای موسڵمانان بەرەو ناوچە کوردییەکان هەر لە دەسپێکەوە لە شاری جەلەولاوە لە ساڵی (١٦ھ/ ٦٣٧ز) تا دەگاتە کۆتا شوێن (دوین) لە ساڵی (٢٥ھ/ ٦٤٥ز) دە ساڵی تێنەپەڕاندووە، کە لەم ماوە کەمەدا زۆربەی کورد تێیدا بوونەتە موسڵمان، ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر ئەوەی ئیسلام لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا بەشێوەیەکی ئاشتییانە و بە قبوڵکردنی خودی کورد بڵاوبۆتەوە، هەروەها ئیسلام بە زەبری شمشێر یا وەك ڕاکردنێك لە سەرانە بڵاونەبۆتەوە وەك هەندێك کەس بانگەشەی ئەمە دەکەن. باس لەوە کراوە زۆربەی ئەو جەنگانەی کە لەگەڵ موسڵماناندا ڕوویانداوە، لەگەڵ گەلی کورد نەبووە، بەڵکو لەگەڵ هێزە داگیرکەرەکانی کوردستان و ئەوانەدا بووە کە بە هاتنی موسڵمانان بەرژەوەندییەکانیان زیانی پێکەوت •

ئەم بابەتە لە بنەڕەتدا لێکۆڵینەوەیەکە کە توێژەر لە کۆنگرەیەکی زانستی لە زانکۆی موسڵ لە ساڵی ٢٠٠٥ پێشکشی کردووە، بۆ دەوڵەمەندکردنی بواری ڕۆشنبیری مێژوویی کورد بە پێویستی زانی بڵاوی بکاتەوە •

COVER DESGIN

**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس

/TafseerOffice
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

التفسير